# پەنجا پرسیار و وەلام

## لەسەر بیروباوەڕ

دانراوی: شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب

وەرگێڕانی: نارین کوردی

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

إنَّ الْحمْد لِلهِ نحمده ، ونسْتَعينُه ، وَنستغفِره ، ونعوذُ بِاللهِ مِنْ شُرورِ أَنْفسنا ومنْ سيّئاتِ أعْمَالِنا ، مَنْ يهْده الله فلا مُضلَّ له ، ومنْ يُضْلِلْ فَلا هاديَ لهُ ، وأشهدُ أَنْ لا إلهَ إلا الله ، وحْدَه لا شَريكَ لهُ ، إِقْرَارًا بِهِ وَتَوْحِيدًا وأشْهدُ أَنَّ مُحمدًا عبدهُ ورسُولُه صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمَ تسليمًا مَزِيدًا .

{ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلاَ تَمُوتُنَّ إِلاَّ وَأَنتُم مُّسْلِمُون }

{ يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً ۚ وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا }

{ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا * يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا } .

**أما بعد:** فإنَّ خيرَ الحديثِ كتابُ اللهِ ، وخيرَ الهدي هديُ محمدٍ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، وشرَّ الأمورِ مُحْدَثَاتُهَا ، وكُلَّ محدثةٍ بدعةٌ ، وكُلَّ بدعةٍ ضلالةٌ ، وكُلَّ ضلالةٍ في النَّار .

بزانە ڕەحمەتی الله تعالی لە تۆ بێت کە گرنگترین شت لەژیانی مرۆڤەکاندا ئەوەیە کەوا لەژیانی دونیایاندا لەسەر عەقیدە و بیروباوەڕێك بن کە دانەری زەوی و ئاسمانەکان پێی ڕازی بێت بۆئەوەی لەڕۆژی دواییدا ببێتە هۆکارێك بۆ لێخۆشبوونی لەلایەن الله تعالی و چۆنە ناو بەهەشتەکەیەوە و نەچۆنە جەهەننەمەوە ، سەربەرزی و سەرفرازی بۆ ئەو کەسەی لەم دونیایە کاتیەدا کارێك ناکات و لەسەر عەقیدە و بیروباوەڕێك نابێت کە بەهەشتێکی هەتاهەتایی پێ بدورێنێت ، دوای فەزل و ڕەحمەتی الله تعالی هەلساوین بەوەرگێڕانی بەرهەمێکی (شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب) بەناوی (خمسون سؤالا وجوابا في العقيدة) تاوەکو ڕۆلەکانی کورد عەقیدە و بیروباوەڕێکی ڕاست و دروستیان هەبێت و بێبەش نەبن لەو بەرهەمە باش و پڕ بایەخ و پڕ مانایەی شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب ڕەحمەتی الله تعالی ی لێبێت ، الله تعالی نیەتمان خالص بکات بۆ خۆی و ئەوەی ڕاستە و دروستە لەلایەن الله تعالی وەیە و ئەوەیشی هەلە و کەموکورتییە لەئێمەی بەندەی کەم عیلم و گوناهبار و کەمتەرخەمەوەیە .

پ1/ ئەو سێ بنەما و بنچینانە چین کە پێویستە لەسەر مرۆڤ بیانزانێت ؟

و1/ بەندە پەروەردگار و ئاین و پێغەمبەرەکەی محمد (صلى الله عليه وسلم) بناسێت .

پ2/ پەروەردگارت کێیە ؟

و2/ پەروەردگارم ئەوەیە کەپەروەردەی من و هەموو جیهانیانی کردووە بەنیعمەتەکانی و ئەو پەرستراوی منە و هیچ پەرەستراوێکی تریشم نییە جگە لە ئەو بەڵگەش وتەی الله تعالی یە کە فەرموویەتی: ( الْحَمْدُ للّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ )[1] ، واتە: ( سوپاس و ستایش هەر شایستەی خوایە و بۆ خوایە ، کە خاوەن و پەروەردگاری هەموو جیهانیان و هەموو بوونەوەرە ) و هەموو شتێك جگە لە الله جیهانە و منیش لەم جیهانەم .

پ3/ واتای پەروەردگار چییە ؟

و3/ خاوەن پەرستراو و بەدەستەڵات و جێبەجێکار ب و ئەو شایەنی پەرستنە .

پ4/ چۆن و بە چ شتێك پەروەردگارت ناسی ؟

و4/ بە نیشانەکانی و بەلگەکانی و دروستکراوەکانی ، وە لەنیشانە و بەلگەکانی وەك: شەو و ڕۆژ و خۆر و مانگ ، وە لە دروستکراوەکانی وەك: هەر حەوت ئاسمانەکە و ئەوەیشی تێیدایە و هەر حەوت زەویەکە و ئەوەیشی تێیدایە و لەنێوانیاندایە ، وە بەڵگەش لەسەریان وتەی الله تعالی یە کەوا فەرموویەتی: ( وَمِنْ آيَاتِهِ اللَّيْلُ وَالنَّهَارُ وَالشَّمْسُ وَالْقَمَرُ لَا تَسْجُدُوا لِلشَّمْسِ وَلَا لِلْقَمَرِ وَاسْجُدُوا لِلَّهِ الَّذِي خَلَقَهُنَّ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ )[2] .

واتە: ( لەنیشانە و بەڵگەکانی دەسەڵاتی پەروەردگار شەو و ڕۆژ و خۆر و مانگە ، هەرگیز نەکەن سوژدە بۆ خۆر ، یان مانگ ببەن ، بەڵکو سوژدە تەنها بۆ ئەو خوایە ببەن کەدروستی کردوون ، ئەگەر ئێوە خۆتان بەبەندەی ڕاستەقینەی ئەو دەزانن وە هەر ئەو دەپەرستن ).

---

[1] سوره الفاتحة: 2

[2] سورة فصلت: 37

وه وتەی الله تعالی: ( إِنَّ رَبَّكُمُ اللّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ يَطْلُبُهُ حَثِيثاً وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ وَالنُّجُومَ مُسَخَّرَاتٍ بِأَمْرِهِ أَلاَ لَهُ الْخَلْقُ وَالأَمْرُ تَبَارَكَ اللّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ )[3] .

واتە: ( بێگومان پەروەردگارتان ( الله ) یە کە دروستکاری ئاسمانەکان و زەویە لە ماوەی شەش ڕۆژدا ( مەگەر هەر خۆیشی بزانێت ئەو ڕۆژانە ماوەیان چەندە )، پاشان لەسەر عەرش و تەختی فەرمانڕەوایی وەستا ( ئەڵبەتە چۆنیەتیی وەستان و تەختی فەرمانڕەوایەتی و گەلێ شتی لەو بابەتانە لەرادەی بۆچوونی ئێمە بەدەرە ، تەفسیری ئەم ئایەتەیان لە پێشەوا مالیک و ئەحمەد پرسیووە ، لە وەڵامدا وتوویانە: وەستانەکە حەقیقەتی هەیە ، چۆنیەتیەکەی شاراوەیە ، پرسیار کردن دەربارەی بیدعەیە ، باوەڕ بوون پێی واجبە )، بەشەو ، ڕۆژ دادەپۆشێت ؛ لەکاتێکدا بەشێنەیی عەوداڵە بەدوایدا ، خۆرو مانگ و ئەستێرەکان ( هەر هەموویان ) بە فەرمانی خوا کەوتوونەتە گەڕو لە فەرمانی دەرناچن ، ئاگادار بن و بزانن و تێفکرن کە: هەرچی دروستکردن و بڕیاردانە هەر بۆ ئەوە ، (کەواتە دەبا هەمووان فەرمانبەرداری ئەو بین و لە فەرمانی دەرنەچین )، موبارەك و پیرۆز و گەورەیە زاتی ( الله ) پەروەردگاری جیهانیان ).

## پ5/ ئاینت چییە ؟

و5/ ئاینم ئیسلامە ، وە ئیسلامیش بریتیە لە تەسلیم و ملکەچبوون بۆ الله ی تاك و تەنیا وە بەڵگەش بۆ ئەمە وتەی الله تعالی یە کەفەرموویەتی: ( إِنَّ الدِّينَ عِندَ اللّهِ الإِسْلاَمُ )[4] .

واتە: ( بەڕاستی دین و ئاینی پەسەند لای خوا تەنها ئاینی ئیسلامە ).

وە بەلگەیەکی تر وتەی الله تعالی کەدەفەرموێت: ( وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الإِسْلاَمِ دِيناً فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ )[5] .

واتە: ( جائەوەی بێجگە لە ئاینی ئیسلام پەیڕەوی هەر ئاینێکی تر بکات لێی وەرناگیرێت ، لەقیامەتیشدا لەخەسارەتمەند و زەرەرمەندانە ).

---

[3] سورة الأعراف: 54

[4] سورة آل عمران: 19

[5] سورة آل عمران: 85

وه بەلگەیەكی تر وتەی الله تعالی كەوا فەرموویەتی: ( الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِيناً )[6] .

واتە: ( ئەمرۆ ئاین و بەرنامەكەتانم بەكۆتایی گەیاند و ناز و نیعمەتی خۆمم بۆ تەواو كردن و ڕازیم بەوەی كە ئیسلام ببێتە بەرنامەو دین و ئاینتان ).

## پ6/ ئەم ئاینە لەسەر چی بنیادنراوە ؟

و6/ لەسەر پێنج پایە بنیادنراوە ، یەكەمیان شایەتیدانە بەوەی هیچ پەرەستراوێك بەحەق نییە جگە لە الله و محمدیش (صلى الله عليه وسلم) بەندە و پێغەمبەری الله یە ، وە نوێژ بكەیت ، وە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بگریت ، وە زەكات بدەیت ، وە حەجی ماڵی الله بكەیت ئەگەر لەتواناتدا بوو .

## پ7/ باوەڕ ( ئیمان ) چییە ؟

و7/ باوەڕت هەبێت بە الله و فریشتەكانی و كتێبەكانی و پێغەمبەرەكانی و ڕۆژی دوایی و باوەڕت هەبێت بەقەدەر بەخێر و شەڕ ( چاكە و خراپە ) ، وە بەڵگەش لەسەر ئەمە وتەی الله تعالی یە كەوا فەرموویەتی: ( آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَنَ بِاللّهِ وَمَلآئِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ )[7] ، واتە: ( پێغەمبەر و ئیمانداران باوەڕیان هەیە بەوەی لەلایەن پەروەردگاریانەوە هاتۆتە خوارەوە ، هەموویان باوەڕیان هەیە بە خوا و فریشتەكانی و كتێبەكانی و پێغەمبەرەكانی ).

## پ8/ چاكە چییە ؟

و8/ چاكە ئەوەیە الله بپەرستیت وەكو چۆن ببینی ئەگەر تۆ الله نەبینیت ئەوا الله تۆ دەبینێت و بەڵگەش وتەی الله تعالی یە كەوا فەرموویەتی: ( إِنَّ اللّهَ مَعَ الَّذِينَ اتَّقَواْ وَّالَّذِينَ هُم مُّحْسِنُونَ )[8] ، واتە: ( چونكە بەڕاستی خوا لەگەڵ ئەو كەسانەدایە كە خۆیان پاراستووە لە گوناهو هەروەها ئەوانەش كە چاكەكار و چاكەخوازن ).

---

[6] سورة المائدة: 3

[7] سورة البقرة: 285

[8] سورة النحل: 128

پ9/ کێ پێغەمبەرتە ؟

و9/ پێغەمبەرم محمدی کوڕی عبداللە ی کوڕی عبدالمطلب ی کوڕی هاشمە ، وە هاشمیش لەقوڕەیشە ، وە قوڕەیشیش لەکینانەیە ، وە کینانەش لەعەرەبە ، وە عەرەبیش لەنەوەی إسماعیلی کوڕی ئیبراهیمە ، وە إسماعیلیش لەکوڕەکانی ئیبراهیمە ، وە ئیبراهیمیش لەنەوەی نوحە (علیهم الصلاة والسلام) .

پ10/ بەچ شتێك پەیامی پێدرا ؟ وە بە چ شتێك نێردرا و کرا بەپێغەمبەر ؟

و10/ پەیامی پێدرا بە ( إقرأ ) واتە بخوێنە ، وە بە نێردرا بە ( المدثر ) واتە ئەو کەسەی جلکی خەوی بەخۆیەوە پێچاندووە .

پ11/ موعجیزەکەی پێغەمبەر (صلی اللە علیه وسلم) چیبوو ؟

و11/ ئەم قورئانەبوو کە هەموو دروستکراوەکان دەستەوەستان بوون لەبەردەمی و نەیانتوانی یەك سورەت هاوشێوەی ئەو قورئانە بهێنن ، وە لەگەڵ ئەوەی زمان پاراوی و زیرەکی ودژایەتیان بۆخۆی وشوێن کەوتوانی ، وە بەڵگەش لەسەری وتەی اللە تعالی یە کەوا فەرموویەتی: ( وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَى عَبْدِنَا فَأْتُواْ بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ وَادْعُواْ شُهَدَاءكُم مِّن دُونِ اللّهِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ )[9] .

واتە: ( جا ئەگەر ئێوە لە دوو دڵیدان و گومانتان لەم ( قورئانە پیرۆزە ) هەیە کە دامانبەزاندووە بۆ بەندەی خۆمان محمد (صلی اللە علیه وسلم) ئەگەر بۆتان دەکرێت ئێوەش هەوڵ بدەن سوورەتێکی وەك ئەو بهێنن ، هاوپەیمان و هاوکارەکانیشتان جگە لە خوا ( بۆ ئەو مەبەستە ) بانگ بکەن ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن ).

وە لەئایەتێکی تردا اللە تعالی فەرموویەتی: ( قُل لَّئِنِ اجْتَمَعَتِ الإِنسُ وَالْجِنُّ عَلَى أَن يَأْتُواْ بِمِثْلِ هَذَا الْقُرْآنِ لاَ يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيراً )[10] .

واتە: ( ئەی محمد صلی اللە علیه وسلم پێیان بڵێ: سوێند بەخوا ئەگەر هەموو ئادەمیزاد و پەریەکان کۆببنەوە و ( هەوڵی بەردەوام بدەن تا ) قورئانێکی وەکو ئەمە

[9] سورة البقرة: 23
[10] سورة الإسراء: 88

دانێن و بیهێننه (مەیدان) ناتوانن کاری وابکەن و ناتوانن لە وێنەی بهێنن ، ئەگەر چی هەموو لایەکیان ببنە پشتگیر و یارمەتیدەری یەکتر ).

## پ12/ بەڵگە چییە لەسەر ئەوەی کە محمد پێغەمبەری الله یە ؟

و12/ بەڵگە وتەی الله تعالی یە کەوا فەرموویەتی: ( وَمَا مُحَمَّدٌ إِلاَّ رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ الرُّسُلُ أَفَإِن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ انقَلَبْتُمْ عَلَى أَعْقَابِكُمْ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىَ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ اللّهَ شَيْئاً وَسَيَجْزِي اللّهُ الشَّاكِرِينَ )(11) .

واتە: ( محمد (صلی الله علیه وسلم) تەنها پێغەمبەرێك نەبووە وەفات بکات ، بێگومان پێغەمبەرانی پێش ئەمیش (وەفاتیان کردووە ) ، ئایا ئەگەر وەفاتی کرد یان کوژرا و شەهید بوو ، ئێوە پاشگەزدەبنەوە و هەڵدەگەڕێنەوە ؟! ( لەو دین و ئاینەی کە پێی ڕاگەیاندوون ) خۆ ئەوەی هەڵگەڕێتەوە و پاشگەزبێتەوە ، ئەوە هەرگیز زیان بەخوا ناگەیەنێت ، لەداهاتویەکی نزیکدا خوای گەورە پاداشتی سوپاسگوزاران دەداتەوە ).

وە بەڵگەیەکی تر وتەی الله تعالی یە کەوا فەرموویەتی: ( مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ اللَّهِ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاء عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاء بَيْنَهُمْ تَرَاهُمْ رُكَّعاً سُجَّداً )(12) .

واتە: ( محمد (صلی الله علیه وسلم) ڕەوانەکراوی خوایە ، ئەوانەش کە لەخزمەتیدان و شوێنی کەوتوون توند و تیژن بەرامبەر بێ باوەڕان و بەبەزەیی و میهرەبانن لەنێوان خۆیاندا ، دەیانبینیت سەرگەرمی نوێژ و خواپەرستین ، کڕنۆش و سوژدە دەبەن ).

## پ13/ بەڵگە چییە لەسەر پێغەمبەرایەتی محمد ؟

و13/ بەڵگە لەسەر پێغەمبەرایەتی محمد وتەی الله تعالی یە کەوا فەرموویەتی: ( مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَكِن رَّسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ )(13) .

واتە: ( محمد وەنەبی باوکی هیچ کەس لە پیاوانتان بێت بەڵکو پێغەمبەری خوایەو دواهەمینی پێغەمبەرانە ).

---

[11] سورة آل عمران: 144
[12] سورة الفتح: 29
[13] سورة الأحزاب: 40

ئەم ئایەتانە دەلالەت لەوە دەکەن کە محمد ( صلی اللە علیە وسلم ) پێغەمبەرە و کۆتا پێغەمبەریشە .

## پ14/ اللە محمدی بۆچی ناردووە ؟

و14/ پەرستنی اللە بەتاك و تەنها کە هیچ هاوەڵ و هابەشێکی نییە ، وە لەگەڵ اللە دا هیچ خودایەکی تر نەپەرەستن ، وە ڕێگری لێکردون لەپەرستنی دروستکراوەکان لە فریشتە و پێغەمبەران و پیاوچاکان و بەرد و دار ، هەروەکو چۆن اللە تعالی فەرموویەتی: ( وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ )[14] .
واتە: ( ئێمە پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێکمان ڕەوانە نەکردووە ، کە وەحیمان بۆ نەناردبێت بەوەی کە: بێگومان هیچ خوایەك نییە جگە لە من و دەبێت هەر من بپەرستن ).

وە هەر اللە تعالی فەرموویەتی: ( وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولاً أَنِ اعْبُدُواْ اللّهَ وَاجْتَنِبُواْ الطَّاغُوتَ )[15] ، واتە: ( سوێند بە خوا بێگومان ئێمە لەناو هەر گەل و نەتەوەیەکدا پێغەمبەرێکمان ڕەوانەکردووە و پێمان ڕاگەیاندووە کە پێیان بڵێت: تەنها خوا بپەرستن ، خۆتان دوورە پەرێز بگرن لە هەموو پەرستراوێکی تر ).

وە وتەیەکی تری اللە تعالی کەوا فەرموویەتی: ( وَاسْأَلْ مَنْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رُّسُلِنَا أَجَعَلْنَا مِن دُونِ الرَّحْمَنِ آلِهَةً يُعْبَدُونَ )[16] ، واتە: ( تۆ لەو پێغەمبەرانەی کە ناردوومانە پێش تۆ بپرسە ، ئایا جگە لە خوای میهرەبان خوای ترمان دیاری کردووە کە بەندایەتی بۆ بکرێت ). مەبەست ئەوەیە کە سەرچاوەی هەموو پێغەمبەران یەکێکە .

وە وتەی اللە تعالی کەوا فەرموویەتی: ( وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ )[17] .
واتە: ( بێگومان من پەری و ئادەمیزادم دروست نەکردووە تەنها بۆ ئەوە نەبێت کە من بپەرستن و فەرمانبەردارم بن ).

---

[14] سورة الأنبياء: 25
[15] سورة النحل: 36
[16] سورة الزخرف: 45
[17] سورة الذاريات: 56

پ15/ جیاوازی چیه لەنێوان تەنها الله پەرستی لەپەروەردگارێتی ( توحید الربوبیة ) وە تەنها الله پەرستی لەپەراستراوێتی ( توحید الألوهیة )؟

و15/ تەنها الله پەرستی لەپەروەردگارێتی ( توحید الربوبیة ) : ئیشی پەروەردگارە ، وەك: دروستکردن و ڕزق و ڕۆزی و زیندووکردنەوە و مراندن و باراندنی باران و ڕواندنی ڕووەك و جێبەجێکردن و بەڕێوەبردنی کاروبارەکان .

وە تەنها الله پەرستی لەپەرستراوێتی ( توحید الألوهیة ) : ئیشی بەندەیە ، وەك: پاڕانەوە و ترسان و هیواو ئومێد پێ بوون و پشت بەستن و پەشیمانبوونەوە و حەزکردن بەگەیشتن بەو شتەی پێی خۆشە و ترس لەو شتەی تووشی ببێت و نەزرکردن ( شتێك لەسەر خۆت واجب بکەیت ) و هانابردن و غەیری ئەوانەش هەر جۆرێك بێت لەجۆرەکانی تری عیبادەت و پەرستن .

پ16/ ئەو جۆرە عیبادەتانە چین کە نابێت بۆ غەیری الله ئەنجام بدرێن ؟

و16/ لەجۆرەکانی: پاڕانەوە ، وە هانابردن ، وە داوای یارمەتی کردن ، وە سەربڕینی قوربانی ، وە نەزرکردن (شت لەسەرخۆت واجب بکەیت)، وە ترسان ، وە هیواو ئومێد پێ بوون ، وە پشت بەستن ، وە پەشیمانبوونەوە ، وە خۆشەویستن ، وە ترس ، وە حەزکردن بەگەیشتن بەو شتەی پێی خۆشە ، وە ترس لەو شتەی تووشی ببێت ، وە پەرستن و عیبادەت ، وە ڕکوع بردن ، وە سوجدە بردن ، وە خشوع (خۆنزم کردنەوە و زەلیل کردن و ترسان )، وە چەمینەوە و خۆبەکەم زانین بەرامبەر الله ، وە بەگەورەدانان کە بریتیە لەتایبەتمەندییەکانی پەرەستراوێتی ( الالوهیة ).

پ17/ ئەنجامی ئەو کردەوانە چین کە الله فەرمانی پێکردووە ؟ وە گەورەیی ئەو ڕێگریانە کە الله ڕێگری لێکردوون ؟

و17/ ئەنجامی ئەو کردەوانە کە الله فرمانی پێکردووە بریتیە لە تەنهاپەرستنی الله لەعیبادەتەکان دا ، وە گەورەترینی ئەو ڕێگرییانەی کە الله ڕێگری لێکردوون بریتیە لەهاوەڵ و هاوبەشیدانان بۆی ، وە بریتیە لەوەی لەگەڵ الله دا داوا لەغەیری الله ش بکات یان مەبەستی لەغەیری ئەوانە بێت لەجۆرەکانی عیبادەت و پەرستن ، هەرکەسێك

شتێك لەجۆرەكانی عیبادەت ئەنجامبدات بۆ غەیری الله ئەوا ئەوی كردووە بە خودا و پەروەردگار و هاوبەشی بۆ الله ئەنجام داوە ، یان لە عیبادەتەكانی تریش هەمان شت بكات و مەبەستی هەبێت لەعیبادەتەكانی تر .

پ18/ ئەو سێ بابەتانە چین كە پێویستە فێری بیت و كردەوەی پێ بكەی ؟

و18/ بابــەتی یەكەم: ئەوەیە الله دروســتی كــردووین و ڕزقــی داویــن و پشــت گــوێی نەخستوین بەڵكو پێغەمبەری بۆ ناردووین كە هەركەسێك گوێڕایەڵی بكات دەچێتە بەهەشتەوە وە هەركەسێك سەرپێچی بكات دەچێتە دۆزەخەوە .

بابەتی دووەم: الله ڕێگەنادات هیچ یەكێك بكەیتە هاوەڵ و هاوبەشی لەپەرەستنیدا نەفریشتەی نزیك و نەپێغەمبەرێكی نێردراو .

بابەتی سێیەم: هەركەسێك گوێڕایەڵی پێغەمبەری كرد (صلی الله علیە وسلم) و الله ی بەتاك ڕاگرت نابێت خۆشەویستی و گوێڕایەڵی بۆ كەسێك هەبێت كە دژایەتی الله و پێغەمبەرەكەی دەكەن (صلی الله علیە وسلم) ئەگەر نزیكترین كەسیشی بێت .

پ19/ واتای الله چییە ؟

و19/ واتای خاوەن پەرەستراوێتی و پەرەستنێتی یە لەسەر هەموو دروستكراوەكانی .

پ20/ الله بۆچی دروستی كردووی ؟

و20/ بۆ پەرستنی .

پ21/ پەرەستنەكەی چییە ؟

و21/ تاك ڕاگرتنی (بەتەنها پەرستنی) و گوێڕایەڵیكردنی .

پ22/ بەڵگە چیە لەسەر ئەوە ؟

و22/ وتەی الله تعالی یە كەوا فەرموویەتی: ( وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ )[18] .

---

[18] سورة الذاريات: 56

واتە: ( بێگومان من پەری و ئادەمیزادم دروست نەکردووەتەنها بۆ ئەوە نەبێت کە من بپەرستن و فەرمانبەردارم بن ).

پ23/ یەکەم شت کە الله لەسەرمانی واجب کردووە چییە ؟

و23/ کوفرکردنە بەطاغووت و باوەڕهێنانە بە الله ، بەڵگەش لەسەر ئەمە وتەی الله تعالی یە کەوا فەرموویەتی: ( لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّۚ فَمَن يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ لَا انفِصَامَ لَهَاۗ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ )[19] .

واتە: ( ئەوەی باوەڕی نەبێت بە _ تاغوت _ ( کە بریتیە لە: هەموو ڕێگە و ڕێباز و هێز و بەرنامە و لادان و بتێک ) و باوەڕی دامەزراو بهێنێت بەخوا ، جا بێگومان ئەو کەسە دەستی گرتووە بەبەهێزترین هۆکاری ڕزگارییەوە ، شوێن دامەزراوترین بیروباوەڕ کەوتووە ، کە هیچ پسان و هەڵوەشاندنەوەیەکی بۆ نییە و هەمیشە پتەو و دامەزراوە ، خوای گەورەش بیسەر و زانایە ).

پ24/ هۆکاری ڕزگاری ( پەتی بەهێز و پتەو ) چییە ؟

و24/ لا إله إلا الله ، وە واتای لا إله: لادانە (النفي) ، وە إلا الله: جێگیربوونە (إثبات).

پ25/ لادان و جێگیربوون ( النفي والاثبات ) لێرەدا چییە ؟

و25/ نەهێشتنی هەموو ئەوانەی کەجگە لە الله دەپەرەسترێن ، وە جێگیربوونی عیبادەت و پەرستن بۆ الله بێ هاوبەش بۆ پەیداکردن .

پ26/ بەڵگە چییە لەسەر ئەوە ؟

و26/ وتەی الله تعالی یە کە دەفەرموێت : ( وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِ إِنَّنِي بَرَاء مِّمَّا تَعْبُدُونَ )[20] .

واتە: ( ئەو کاتە بیهێنەوە یاد کە ئیبراهیم بە باوکی و هۆزەکەی خۆی وت: بەڕاستی من دوورە پەرێزم لەو شتانەی کە ئێوە دەیپەرستن ).

---

[19] سورة البقرة: 256

[20] سورة الزخرف: 26

ئەمە بەڵگەیە لەسەر لادان (نفي)، وە بەڵگەی جێگیربوون بریتیە لە: ( إِلَّا الَّذِي فَطَرَنِي )[21] ، واتە: ( جگە لەو زاتەی کە دروستی کردووم ، هەر ئەویش ڕێنموویم دەکات وە دەمخاتە سەر ڕێگەی ڕاست و دروست ).

پ27/ چەند طاغوت هەیە ؟

و27/ زۆرن وە سەرەکانیان پێنجن: إبلیس نەفرەتی الله ی لێبێت ، وە ئەوەی دەپەرسترێت و پێی ڕازیە ، وە ئەوەی بانگەشەی خەڵك دەكات بۆ پەرستنی خۆی ، وە ئەوەی بانگەشەی شتێك بكات لە زانستی غەیب (واتە بلێت من فلانە شت کە غەیبە دەزانم)، وە ئەوەی حوكم دەكات بە جگە لەوەی الله دایبەزاندووە .

پ28/ چ کردەوەیەك باشترینە لەپاش دوو شایەتومانەکە ؟

و28/ باشترینیان پێنج نوێژەکەیە ، وە چەندین مەرج و پایە و پێویستی (واجبات) ی هەیە ، گەورەترین مەرجی ( شرط ) بریتیە لەئیسلامەتی ( واتە کەسەکە موسلمان بێت و کافر نەبێت )، وە عاقڵ بێت ( واتە شێت نەبێت )، وە جیاکردنەوە ( جیاکردنەوەی چاکە و خراپە )، پاکێتی و نەبوون و لادانی بێ دەستنوێژی گەورە و بچووك ، وە لابردنی پیسی ، وە داپۆشینی عەورەت ، وە ڕووکردنە قیبلە ، وە چونە ناو کات ( واتە کاتی نوێژەکە هاتبێت )، وە نیەت .

وە پایەکانی ( ڕووکنەکانی ) چواردەن: نوێژکردن بەپێوە بەگوێرەی توانا ، وە تەکبیری ئیحرام ( الله أکبر ی نوێژ دەست پێکردن )، وە خوێندنەوەی سورەتی فاتیحە ، وە رکوع بردن ، وە هەستانەوە لەبردنی رکوع ، وە سوجدەبردن لەسەر حەوت ئەندام ، وە ڕاوەستان تێدا بەشێوەیەکی ڕێك تا دلنیا دەبی ، وە دانیشتنی نێوان دوو سوجدەکە ، وە دڵنیابوون لەهەموو ئەو پایەیانەی نوێژ کە ئەنجامتداون ، وە تەرتیب ( ئەنجامدانی ئەم پایەیانە یەك بەدوای یەك بەو ڕیزبەندییەی کە باسمانکردوون )، وە تەحیاتی کۆتایی و دانیشتن تێیدا ، وە سڵاواتدان لەسەر پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم)، وە سەلام دانەوە .

---

[21] سورة الزخرف: 27

واجبەکانی (پێویستیەکانی ) هەشتن: هەموو تەکبیرەکان جگە لەتەکبیری ئیحرام ( واتە جگە لەتەکبیری دەستپێکردنی نوێژ )، وتنی (سبحان ربي العظيم) لەکڕنۆش بردن (الركوع )، هەستانەوە لەرکوع و وتنی (سمع الله لمن حمده) بۆ ئیمام ( پێشنوێژخوێن ) و تاك (ئەگەر کەسێك بەتەنهاش نوێژ بکات هەر واجبە بلێت سمع الله لمن حمده)، وتنی (ربنا ولك الحمد) بۆ ئیمام و ئەوانەی لەپشتییەوە نوێژ دەکەن و بۆ کەسی تاکیش (ئەو کەسەی بەتەنها نوێژ دەکات)، چوونە سوجدە و وتنی (سبحان ربي الأعلى) لەسوجدەدا ، وتنی (رب اغفر لي) لەنێوان دوو سوجدەکەدا ، تەحیاتی یەکەم و دانیشتن تێیدا ، وە ئەوانی تر بێجگە لەمانە سونەتی وتەیی و کردەوەیین .

پ29/ ئایا الله پاش مردن دروستکراوەکان زیندوو دەکاتەوە ؟ وە لێپێچینەوەیان لەگەڵ دەکات لەسەر کردەوە چاك وخراپەکانیان ؟ وە ئەوەی گوێڕایەڵی کردبێت دەیخاتە بەهەشتەوە ؟ وە ئەوەی کوفری پێ کردبێت و هاوەڵی بۆ پەیداکردبێت لەئاگردایە ؟

و29/ بەڵێ وە بەڵگەش وتەی الله تعالى یە کەوا فەرموویەتی: ( زَعَمَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَن لَّن يُبْعَثُوا قُلْ بَلَى وَرَبِّي لَتُبْعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلْتُمْ وَذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِير )[22] .

واتە: ( ئەوەش بۆیە پێشهات چونکە پێغەمبەران بەجۆرەها بەڵگەو موعجیزە ، پەیامی خوایان پێڕاگەیاندن کەچی وتیان: ئەمانە بەشەرن وەکو ئێمە ، چۆن دەبنە پێغەمبەر و چاوساغمان ؟ بەو بیانووە ڕێبازی بێ باوەڕیان هەڵبژارد و پشتیان هەڵکرد ، خوایش پێویستی بەئیمانی ئەوان نیە چونکە خوا خۆی دەوڵەمەندە و بێنیازە و شایستەی سوپاسە ).

وە هەر الله تعالى لەم بارەیەوە دەفەرمووێت: ( مِنْهَا خَلَقْنَاكُمْ وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَى )[23] ، واتە: ( ئێمە ئێوەمان هەر لەم زەویە دروست کردووە ، (دوای ماوەیەك) دەتانخەینەوە ناوی ، پاشان جارێکی تر دووبارە لەو زەویە دەرتان دەهێنینەوە (بۆ لێپرسینەوە و وەرگرتنی ئەو پاداشتەی کە شایستەن ).

وە لەقورئاندا بەڵگەی تری زۆر تێدایە .

---

[22] سورة التغابن: 7

[23] سورة طه: 55

## پ30/ حوکمی ئەو کەسە چییە سەربڕاوەکانی بۆ غەیری الله سەردەبڕێت ؟

و30/ حوکمەکەی ئەوەیە کافر و مورتەدە و سەربڕاوەکەی ڕێگەپێدراو نییە (واتە حەلال نییە خواردنی) چونکە دوو ڕێگری تێدا کۆدەبێتەوە :

ڕێگری یەکەم: چونکە سەربڕاوی دەستی مورتەدە و سەربڕاوی دەستی مورتەد بەکۆدەنگی زانایان ڕێگەپێدراو نییە و حەرامە .

ڕێگری دووەم: ئەویە کە بۆ غەیری الله کراوە و الله ئەوەی حەرام کردووە لە قورئانەکەیدا کاتێك فەرموویەتی: ( قُل لاَّ أَجِدُ فِي مَا أُوْحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّماً عَلَى طَاعِمٍ يَطْعَمُهُ إِلاَّ أَن يَكُونَ مَيْتَةً أَوْ دَماً مَّسْفُوحاً أَوْ لَحْمَ خِنزِيرٍ فَإِنَّهُ رِجْسٌ أَوْ فِسْقاً أُهِلَّ لِغَيْرِ اللّهِ بِهِ )[24] .

واتە: ( ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم) پییان بڵێ: من نابینم و دەستم ناکەوێت لەوەی کە وەحی و نیگام بۆ کراوە هیچ خواردنێکی حەرامکراو لەسەر ئەو کەسەی کە بیخوات ، مەگەر خواردنی مردارەوە بوو ، یان خوێنێکی ڕژێنراو ، یان گۆشتی بەراز ، بەڕاستی ئەو قەدەغە کراوە هەر پیسە ، یاخود (ماڵاتێك) کە لە سنووری شەرع دەرچووبێت لە سەربڕینەکەیدا بەوەی کە ناوی غەیری خوای لەسەر برابێت ).

## پ31/ جۆرەکانی شیرك چییە ؟

و31/ جۆرەکانی ئەوەیە: داواکردنی پێداویستییەکان لە مردووەکان ، وە هانایان بۆ بردنیان و ڕوو تێکردنیان ، وە ئەمەش بنچینەی شیرکی جیهانە ، چونکە مردوو کردەوەکانی پچڕاوە ، وە هیچ سوود و زیانێکی بۆ خۆی نییە ، وە هەر کەسێکیش هانای بۆ ببات وە داوای لێبکات شفاعەتی بۆ بکات لای الله ، ئەمەش لەجەهل و نەزانینیەتی بە شافع ( ئەوەی کە خاوەنی شەفاعەتە ) و شەفاعەتی لایە ، جا الله لەهیچ کەسێك شەفاعەت وەرناگرێت ئیللا مەگەر بە ویستی خۆی نەبێت ، وە الله داواکردنی لەجگە لەخۆی نەکردۆتە هۆکارێك بۆ ئەوەی ویستی لێ بێت (شەفاعەت بدات بەهۆی ئەو کەسەوە) ، بەڵکو هۆکاری ئەوەی الله ویستی لەسەر بێت شەفاعەتی بدات ئەوەیە کە تەواویەتی تەوحیدە ، جا ئەو موشریکە بەهۆکارێك هات کە بووە ڕێگر لەوەی الله

[24] سورة الأنعام: 145

شەفاعەتی بدات) واتە داوای لەکەسێکی تر کردووە تاوەك الله شەفاعەتی بدات بەڵام بەو کارەی بووە ڕێگر لەوەی الله شەفاعەتی بات .

وە شیرکیش دوو جۆرە :

شیرکێك کەسەکە لەئیسلام دەردەکات ئەویش شیرکی گەورەیە.

وە شیرکێك کەسەکە لەئیسلام دەرناکات ئەویش شیرکی بچوکە وەك ڕیا .

پ32/ جۆرەکانی دووڕوویی چییە و واتاکەیان چییە ؟

و32/ دووڕوویی دووجۆرە:

جۆری یەکەم: دووڕوویی بیروباوەڕی ، جۆری دووەم: دووڕوویی کردەوەیی .

جۆری یەکەم: دووڕوویی بیروباوەڕی: لەقورئان دا لەچەند شوێنێك باسکراوە وە الله تعالى شوێنی خوارەوەی ئاگری بۆ واجب کردوون .

جۆری دووەم: دووڕوویی کردەوەیی: لەفەرموودەدا هاتووە: [چوار شت لە هەرکەسێکدا هەبن ئەوا دووڕووی (مونافقی) تەواوە ، وە ئەگەر خەسڵەتێکی لەم چوار خەسلەتە تێدابێت ئەوا خەسڵەتێکی دووڕوویی تێدایە تاوازی لێ دێنێت: ئەگەر قسەی کرد ئەوا درۆ دەکات ، وە ئەگەر پەیمانیدا ئەوا پەیمانەکەی دەشکێنێت و هەڵدەوەشێنێتەوە ، وە ئەگەر ناکۆکییەکی هەبێت تاوانی تێدا دەکات ، وە ئەگەر ڕاسپاردەیەکی لەلا دانرا ئەوا خیانەتی لێ دەکات). وە وەکو لەفەرموودەیەکی تردا هاتووە: ( نیشانەی دووڕویی سێ یە: ئەگەر قسەی کرد ئەوا درۆ دەکات ، وە ئەگەر بەڵێنیدا سەرپێچی بەڵێنەکەی دەکات ، وە ئەگەر ڕاسپاردەیەکی لەلا دانرا ئەوا خیانەتی لێ دەکات ).

وە هەندێ لە پیاوە بەڕێزەکان دەڵێن: ئەم دووڕووییە کۆدەبێتەوە لەگەڵ بنچینەی ئیسلام بەڵام ئەگەر هاتوو جێگربوو و کامل بوو ئەوا خاوەنەکەی لەئیسلام دەردەکات بەتەواوی تەنانەت ئەگەر نوێژیش بکات و ڕۆژووش بگرێت ، وە بانگەشەی ئەوە بکات کە موسڵمانە ، چونکە باوەڕ ڕێگری دەکات لەم هەڵانە ، ئەگەر بەندەی کامل کرد و ڕێگری لێنەکرد لەو شتانە ئەوا جگە لەدووڕوویەکی تەواو هیچی تر نییە .

پ33/ پلەوپایەی دووەم چییە لەپلەوپایەکانی دینی ئیسلام؟

و33/ باوەڕ (الإيمان) .

پ34/ باوەڕ چەند بەشە ؟

و34/ حەفتا و شتێك بەشە ، بەرزترینیان وتنی ( لا إلـه إلا الله ) وە نزمترینیان لابردنی بەربەست و ئازارێکە لەڕێگا ، وە شەرمیش بەشێکە لەباوەڕ .

پ35/ باوەڕ چەند پایەی هەیە ؟

و35/ شەش پایەی هەیە:- باوەڕت هەبێت بە الله ، وە بەفریشتەکانی ، وە بەکتێبەکانی ، وە بەپێغەمبەرانی ، وە بە ڕۆژی دوایی ، وە باوەڕت هەبێت بە قەزا و قەدەر (القضاء والقدر) بەخێر و شەڕی (چاکە و خراپەی).

پ36/ پلەوپایەی سێیەم چییە لەپلەوپایەکانی دینی ئیسلام؟

و36/ چاکەکردن ، وە یەك پایەی هەیە ، ئەویش ئەوەیە الله بپەرستیت وەك چۆن ببینیت ئەگەر تۆ الله نەبینی ئەو تۆ دەبینێت .

پ37/ ئایا خەڵك لێپێچینەوەیان لەگەل دەکرێت و پاداشت وەردەگرن لەسەر کردەوەکانیان دوای زیندووبوونەوە یان نا ؟

و37/ بەڵێ لێپێچینەوەیان لەگەل دەکرێت و پاداشت وەردەگرن لەسەر کردەوەکانیان بەبەڵگەی وتەی الله تعالى: ( لِيَجْزِيَ الَّذِينَ أَسَاؤُوا بِمَا عَمِلُوا وَيَجْزِيَ الَّذِينَ أَحْسَنُوا بِالْحُسْنَى )(25) .

واتە: ( تاقیتان دەکاتەوە ) بۆ ئەوەی تۆڵەبسێنێت لەوانەی کەخراپەیان کردووە بەگوێرەی کردەوەکانیان ، پاداشتی ئەوانەش کەچاکەیان کردووە بەچاکترین شێوە بداتەوە ).

[25] سورة النجم: 31

پ38/ حوكمی ئەو كەسە چییە كە زیندووبونەوە بەدرۆ دادەنێت ؟

و38/ حوكمەكەی ئەوەیە كافرە بەبەڵگەی وتەی الله تعالی: ( زَعَمَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَن لَّن يُبْعَثُوا قُلْ بَلَى وَرَبِّي لَتُبْعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلْتُمْ وَذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ )[26] .

واتە: ( ئەوانەی بێ باوەڕ بوون بە بۆچوونی خۆیان وتیان: هەرگیز زیندوو ناكرێنەوە ، پێیان بڵێ: وا نیە ، سوێند بە پەروەردگارم ، بەڕاستی هەر زیندوو دەكرێنەوە ، پاشان ئاگادار دەكرێن لە هەموو ئەو كارو كردەوانەی كە ئەنجامتان دەدا ، ئەوەش بۆ خوا زۆر ئاسان و سادەیە ).

پ39/ ئایا هیچ ئومەتێك هەبووە الله پێغەمبەری بۆ نەناردبێت بۆئەوەی فەرمانیان پێبكات الله بەتاك و تەنها بپەرستن و دوورەپەرێزبن لەطاغووت ؟

و39/ هیچ ئومەتێك نەماوە و نەبووە ئیللا پێغەمبەری بۆ نێردراوە بەبەڵگەی وتەی الله تعالی: ( وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولاً أَنِ اعْبُدُواْ اللّهَ وَاجْتَنِبُواْ الطَّاغُوتَ )[27] .

واتە: ( سوێند بە خوا بێگومان ئێمە لەناو هەر گەل و نەتەوەیەكدا پێغەمبەرێكمان ڕەوانەكردووەو پێمان ڕاگەیاندووە كە پێیان بڵێت: تەنها خوا بپەرستن ، خۆتان دوورە پەرێز بگرن لە هەموو پەرستراوێكی تر ).

پ40/ جۆرەكانی تەنها الله پەرستی (توحید) چین ؟

و40/ جۆری یەكەم: تەنها الله پەرستی لەپەروەردگارێتی ( توحيد الربوبية ) : ئەوەیە كەكافران دانیان پێداناوە وەك چۆن لە وتەی الله تعالی دا هاتووە: ( قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ أَمَّن يَمْلِكُ السَّمْعَ والأَبْصَارَ وَمَن يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ الْمَيَّتَ مِنَ الْحَيِّ وَمَن يُدَبِّرُ الأَمْرَ فَسَيَقُولُونَ اللّهُ فَقُلْ أَفَلاَ تَتَّقُونَ )[28] .

واتە: ( ئەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم پێیان بڵێ: كێ هەیە لەئاسمانەوە (بەهۆی تیشكی خۆر و بارانەوە) و لەزەویەوە (بەهۆی خاك و ئاو و هەواوە) ڕزق و ڕۆزیتان بۆ

---

[26] سورة التغابن: 7

[27] سورة النحل: 36

[28] سورة يونس: 31

فەراهەم بهێنێت و پێتان ببەخشێت ، ئەی کێ هەیەخاوەنی دەزگاکانی بیستن و بینین بێت (توانای بیستن و بینینیان پێ ببەخشێت) ئەی کێ زیندوو لەمردوو دەردەهێنێت و مردوو لەزیندوو دەردەهێنێت ، هەروەها کێیە کە هەموو کار و فرمانەکان جێبەجێ دەکات و گۆڕانکاریان بەسەردا دەهێنێت (لەبەرامبەر هەموو ئەو پرسیارانەوە) خەڵکی دەڵێن: الله ، خوا (هەموو ئەو کارانەو زیاتریش زۆر بەئاسانی ئەنجام دەدات لەرێگەی یاساو بەرنامەیەکەوەکەهەر خۆی دایڕشتووە) ، کەواتە پێیان بڵێ: ئایا ناترسن لەسەرەنجامی یاخی بوونتان ، ئایا ناترسن لەخەشم و قینی خوا ؟!).

جۆری دووەم: تەنها الله پەرستی لەپەراستراوێتی (توحيد الالوهية): ئەویش ئیخلاصە لە پەرستنی الله بەتاك و تەنها لەهەموو دروستکراوێك ، چونکە پەرستراو لەزمانی عەرەب دا مەبەستیان پێی پەرستنە ، وە دەیان وت الله پەرەستراوی پەرستراوەکانە بەڵام پەرستراوی تریان لەگەڵی دەکردە هاوبەش وەکو پیاوچاکان و فریشتەکان ، وە هەندێکی تریان دەیان ووت الله ڕازیە بەمە و داوای شەعاعەتمان بۆ بکەن لای خۆی .

جۆری سێیەم: تەنها الله پەرستی لەصیفەتەکان (توحيد الصفات): تەوحیدی پەروەردگاریەتی (الربوبية) و تەوحیدی پەرستراوێتی (الالوهية) دانامەزرێت تاوەکو دان بە صیفاتەکان نەنێت ، بەڵام کافران ئاقڵترن لەوانەی کە نکۆلی لەصیفات دەکەن .

پ41/ چی پێویست و واجب دەبێت لەسەرم ئەگەر الله فەرمانی پێکردم بەکارێك ؟

و41/ حەوت پلەوپایەت لەسەر واجب دەبێت:

یەکەم: زانینی .

دووەم: خۆشویستنی .

سێیەم: پێداگری و بەردەوامی لەسەر ئەو کارە .

چوارەم: کردەوەپێکردنی .

پێنجەم: بەو پێیەی شەرع ڕێگەی پێداوە بەنیازپاکی و دروستی .

شەشەم: ئاگادارکردبوون لەو کارەی کە هەلیدەوەشێنێتەوە .

حەوتەم: خۆڕاگری و بەردەوامبوون لەسەری .

پ42/ ئەگەر مرۆڤ زانی الله فەرمانی پێکردووە بە تەنها الله پەرستی وە ڕێگری لێکردووە هاوەل و هاوبەشی بۆ پەیدابکات ئایا ئەم پلەوپایانەی لەسەر جێبەجێ دەبێت ؟

و42/ پلەی یەکەم: زۆربەی خەڵك زانیویانە کە تەوحید ( تەنها الله پەرستی ) حەقە و ڕاستە ، وە شیرکیش ( هاوەل و هاوبەشدانان بۆ الله ) باطڵە و پوچەلە ، بەڵام پشتی تێکرد و پرسیاری نەکرد! وە زانی کە الله سوو ( ربا ) ی حەرام و قەدەغە کردووە بەڵام ئەو فرۆشتی و کڕی و پرسیاری نەکرد! وە زانی خواردنی ماڵی هەتیوو ( بێ باوك ) حەرامە وە خواردنی بەچاکە ڕێگەپێدراوە ، وە دەستیگرت بەسەر پارە و ماڵی هەتیو و پرسیاری نەکرد! .

پلەی دووەم: خوشویستنی ئەوەی الله دایبەرزاندووە و کافرکردنی ئەو کەسەی ڕقی لێیەتی ، زۆربەی خەڵك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ی خۆش نەویست بەڵکو ڕقی لێ بووەوە و ڕقی لەوەش بووەوە کە پێی هاتووە (واتە ڕقی لەئیسلام بووەوە)، ئەگەریش زانیبێتی الله دایبەزاندووە .

پلەی سێیەم: پێداگری و بەردەوامی لەسەر ئەو کارە ، زۆرێك لەخەڵکی زانی و خۆشی ویست بەڵام پیاگر و بەردەوام نەبوو لەترسی گۆڕانی دونیاکەی ( واتە لەترسی لەدەست دانی خۆشی دونیا ).

پلەی چوارەم: کردەوەکردن وە زۆرێك لەخەڵکی کاتێك پێداگیرە و یاخود کارێکی کرد وە بۆی ڕوون بوویەوە لەو کەسەی بە گەورەی دادەنێت و هاوشێوەی ئەوا تەرکی کردەوە دەکات و وازی لێ دەهێنێت .

پلەی پێنجەم: زۆربەی ئەوانەی جێبەجێیان کرد ئیخلاصیان تێدانەبوو وە ئەگەر ئیخلاصیشیان تێدابوایە ئەوا حەق نەبوو (واتە دروست نەبوو) .

پلەی شەشەم: پیاوچاکان دەترسن لە پوچەڵبوونەوەی کردەوەکانیان بەبەڵگەی وتەی الله تعالى کەوا فەرموویەتی: ( أَن تَحْبَطَ أَعْمَالُكُمْ وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ )[29] .

[29] سورة الحجرات: 2

واتە: ( نەوەکو کردەوەکانتان پووچ بێتەوە و هەستیشی پێ نەکەن ). وە ئەمە کەمترینی شتەکانە لەم سەردەمەی ئێمەدا .

پلەی حەوتەم: بەردەوامبوون و خۆڕاگری لەسەر حەق و ترسان لەکۆتاییەکی خراپ ، وە ئەمە لەگەورەترینی ئەو شتانەیە کە پیاوچاکان لێی ترساون .

پ43/ واتای کوفر و جۆرەکانی چین ؟

و43/ کوفر دوو جۆرە:

جۆری یەکەم: کوفرێك خاوەنەکەی لەئیسلام دەکاتە دەرەوە و ئەویش پێنج جۆرە:

یەکەم: کوفری بە درۆخستنەوە ، الله تعالی فەرموویەتی: ( وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَى عَلَى اللّهِ كَذِباً أَوْ كَذَّبَ بِآيَاتِهِ إِنَّهُ لاَ يُفْلِحُ الظَّالِمُونَ )[30] .

واتە: ( جا کێ هەیە لەوە ستەمکارتر بێت ، کە شتی نادروست و درۆ ، بۆ خوا هەڵدەبەستێت ؟ یان ئایەت و فەرمانەکانی خوا بەدرۆ دەزانێت ؟! چونکە بەڕاستی ئەو ستەمکارانە سەرفراز نابن ).

دووەم: کوفری خۆبەگەورەدانان و لوتبەرزی و گوێ پێنەدان لەگەڵ بەڕاستدانانی (واتە لێرەدا با کارەکە بەڕاست دابنێت بەلام بەهۆی خۆبەگەورەزانین و ئەنجامنەدانی کارەکە کافر دەبێت وەکو سەجدەنەبردنی إبلیس بو ئادەم) ، الله تعالی فەرموویەتی: ( وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلاَئِكَةِ اسْجُدُواْ لآدَمَ فَسَجَدُواْ إِلاَّ إِبْلِيسَ أَبَى وَاسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ الْكَافِرِينَ )[31] .

واتە: ( کاتێکیش بەفریشتەکانمان وت: سوژدە بەرن بۆ ئادەم (سوژدەی ڕێزو بەفەرمانی خوا ، وەکو ڕووگەیەك ) سوژدەیان برد ، جگە ئیبلیس نەبێت کە سەرپێچی کردو خۆی بە گەورەزانی و خۆی خستە ڕیزی کافرەکانەوە ).

سێیەم: کوفری دوودلی ، کە ئەویش کوفری گومانە ، بەلگەش وتەی الله تعالی یە کەوا فەرموویەتی: ( وَدَخَلَ جَنَّتَهُ وَهُوَ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِ قَالَ مَا أَظُنُّ أَن تَبِيدَ هَذِهِ أَبَداً (35) وَمَا أَظُنُّ

[30] سورة الأنعام: 21

[31] سورة البقرة: 34

السَّاعَةَ قَائِمَةً وَلَئِن رُّدِدتُّ إِلَى رَبِّي لَأَجِدَنَّ خَيْراً مِّنْهَا مُنقَلَباً (36) قَالَ لَهُ صَاحِبُهُ وَهُوَ يُحَاوِرُهُ أَكَفَرْتَ بِالَّذِي خَلَقَكَ مِن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ سَوَّاكَ رَجُلاً (37))[32] .

واته: ( رِۆژێك چوو بۆ سەردانی یەكێك لە باخەكانی (لەگەڵ هاوەڵەكەیدا) لەكاتێكدا كە ستەمكار بوو لە خۆی (بەهۆی لە خۆبایی بوونیەوە) ، بۆیە لەبەرخۆیەوە وتی: گومان نابەم كە ئەم باخ و باخاتە هەرگیز لەناو بچێت... واشنازانم قیامەت بەرپا دەبێت ، سوێند بە خوا ئەگەر بمگێڕنەوە بۆ لای پەروەردگارم دوای مردنم ، ئەوە دڵنیام كەلای ئەویش جێگە و ڕێگە و چەندەها باخی ڕازاوەی لەمە باشترم بۆ ئامادە كراوە. هاوەڵە ئیماندارەكەی لەكاتێكدا كە گفتوگۆی لەگەڵدا دەكرد پێی وت: ئایا باوەڕت نەماوە بەو زاتەی كە سەرەتا تۆی لە خاك دروست كردووە ؟! لەوەودوا نوفتەیەك بوویت ، پاشان كردیتی بە پیاو ؟! ).

چوارەم: كوفری پشت هەلكردن ، بەڵگەش وتەی الله تعالی یە كەوا فەرموویەتی: ( وَالَّذِينَ كَفَرُوا عَمَّا أُنذِرُوا مُعْرِضُونَ )[33] .
واته: ( كەچی بێ باوەڕان پشت هەڵدەكەن لەو ئاگاداری و بێداركردنەوەیە ) .

پێنجەم: كوفری دووڕوویی ، بەڵگەش وتەی الله تعالی یە كەوا فەرموویەتی: ( ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ آمَنُوا ثُمَّ كَفَرُوا فَطُبِعَ عَلَى قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ )[34] .
واته: ( ئەو حاڵەتەشیان بۆیە تێدا دروست بووە چونكە سەرەتا باوەڕیان هێنا ؛ لەوەودوا حەقیان پۆشی و كافر بوونەوە ، بەهۆی ئەوەوە مۆر نرا بەسەر دڵیاندا (بۆیە تێگەیشتن و بیروبۆچوونیان شێواوە و) لە ڕاستیەكان تێ ناگەن ).

جۆری دووەم لەجۆرەكانی كوفر: بریتیە لە كوفری بچوك ، كەخاوەنەكەی لەئیسلام دەرناكات ، ئەویش كوفری نیعمەتە ، بەڵگەش وتەی الله تعالی یە كەوا فەرموویەتی :

[32] سورة الكهف: 35 _ 36 _ 37
[33] سورة الأحقاف: 3
[34] سورة المنافقون: 3

( وَضَرَبَ اللّهُ مَثَلاً قَرْيَةً كَانَتْ آمِنَةً مُّطْمَئِنَّةً يَأْتِيهَا رِزْقُهَا رَغَداً مِّن كُلِّ مَكَانٍ فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ اللّهِ فَأَذَاقَهَا اللّهُ لِبَاسَ الْجُوعِ وَالْخَوْفِ بِمَا كَانُواْ يَصْنَعُونَ )[35] .

واتـه: ( خـوا نموونـهی هێناوهتـهوه ( بـه دانیشـتوانی ) شـارێك كـه ژیانیـان بـه هێمنـی و ئاسوودهیی دهبـرده سهر ، له ههمـوو لایهكهوه ڕزق و ڕۆزی جـۆراو جۆریـان بۆ دههـات ( بهڵام لـهجیاتی سوپاسگوزاریی ) ناشوكر و قهدرنـهزانی ناز و نیعمهتـهكانی خـوا بوون ، ئینجا خوای گهوره پۆشاكی برسێتی و ترسی كرده كاڵای باڵایان و تاڵاوی نهداریی و ترسی پـێ چهشتن لـه سـهر ئـهنجامی ئـهو ئیش و كـاره ( ناپوخت و نارێكانـهدا ) كه دهیانكرده پیشهی خۆیان ).

وه فهرموویهتی: ( إِنَّ الإنسَانَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ )[36] .

( بهڕاستی زۆربهی ئینسانهكان زۆر ستهمكارو خوانهناس و سپڵهن ).

پ44/ شیرك چییه و جۆرهكانی چین ؟

و44/ بزانه تهنها الله پهرستی (توحید) دژی هابهشدانانه بۆ الله (الشرك)

هاوبهشدانانیش بۆ الله سێ جۆره:

جۆری یهكهم: هاوبهشدانانی گهوره بۆ الله

جۆری دووهم: هاوبهشدانانی بچوك بۆ الله

جۆری سێیهم: هاوبهشدانانی شاراوه و نادیار بۆ الله

جۆری یهكهم: هاوبهشدانانی گهوره بۆ الله ئهویش چوار جۆره:

یهكهم: هاوبهشـدانان بۆ الله لـهداواڵێكردن و پهرستن و هاوار بۆ كردن: بهلگـهش وتـهی الله تعالی یه كهوا فهرموویهتی: ( فَإِذَا رَكِبُوا فِي الْفُلْكِ دَعَوُا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ فَلَمَّا نَجَّاهُمْ إِلَى الْبَرِّ إِذَا هُمْ يُشْرِكُونَ )[37] .

---

[35] سورة النحل: 112

[36] سورة إبراهيم: 34

[37] سورة العنكبوت: 65

واتە: ( هەر کاتێك خەڵکی (باوەڕ لاواز) سواری کەشتی دەبن ، مەترسی نوقم بوون و تیاچوون ڕوویان تێدەکات ، زۆر بەکوڵ ، هاناو هاوار بۆ خوا دەبەن و بە دڵسۆزی و ملکەچیەوە باوەڕ دەهێنن ، بەڵام کاتێك خوا ڕزگاریان دەکات و دەگەنەوە وشکانی دەستبەجێ لە ڕێبازی یەکتاپەرستی دەترازێن و هاوەڵ و هاوبەش بۆ خوا بڕیار دەدەن ).

دووەم: هاوبەشدانان بۆ الله لەنیەت و ویست و مەبەست: بەلگەش وتەی الله تعالى یە کەوا فەرموویەتی: ( مَن كَانَ يُرِيدُ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَالَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيهَا لاَ يُبْخَسُونَ (15) أُوْلَئِكَ الَّذِينَ لَيْسَ لَهُمْ فِي الآخِرَةِ إِلاَّ النَّارُ وَحَبِطَ مَا صَنَعُواْ فِيهَا وَبَاطِلٌ مَّا كَانُواْ يَعْمَلُونَ )[38] .

واتە: ( هەر کەسێك تەنها ژیانی دنیاو ڕازاوەیی و (خۆشگوزەرانی) یەکەی بوێت ئەوە پاداشتی هەوڵ و کۆششی ئەو جۆرە کەسانە دەدەینەوە لە دنیادا ، ئەوانیش تێیدا هیچیان لێکەم ناکرێتەوە * ئا ئەوانە ئەوانەن کە لە ڕۆژی دوایدا جگە لە ئاگری دۆزەخ هیچی تریان بۆ نیە و ئەوەی کە کردیان لە دنیادا پووچەڵ بۆوە و بێ نرخە ، هەروەها ئەو کاروکردەوەی کە دەیانکرد بەتاڵ و پووچ و بۆشە ).

سێیەم: هاوبەشدانان بۆ الله لەگوێڕایەڵیکردندا: الله تعالى فەرموویەتی: ( اتَّخَذُواْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَاباً مِّن دُونِ اللّهِ وَالْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ وَمَا أُمِرُواْ إِلاَّ لِيَعْبُدُواْ إِلَـهاً وَاحِداً لاَّ إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ سُبْحَانَهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ )[39] .

واتە: ( (گاور و جوو) حاخام و قەشەکانی خۆیان کردۆتە پەروەردگاری خۆیان لەجیاتی خوا ( ملکەچ و فەرمانبەرداریانن ، ئەوانیش بەئارەزووی خۆیان شتیان بۆ حەلاڵ یان حەرام دەکەن ) هەروەها مەسیحی کوڕی مەریەمیش ( بەکوڕی خوا دەزانن ) لەکاتێکدا کە فەرمانیان پێنەدراوە جگە لەپەرستنی تاکە خوایەك ، بێگومان جگە لەو زاتە خوایەکی تر نیە ، پاکی و بێگەردی و ستایش بۆ ئەو زاتەیە ، کە ( ئەو نەفامانە ) هاوەڵی بۆ بڕیار دەدەن ).

---

[38] سورة هود: 15 _ 16

[39] سورة التوبة: 31

چوارەم: هاوبەشدانان بۆ الله لەخۆشەویستندا ، الله تعالى فەرموویەتی: ( وَمِنَ النَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ اللّهِ أَندَاداً يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللّهِ وَالَّذِينَ آمَنُواْ أَشَدُّ حُبّاً لِّلّهِ وَلَوْ يَرَى الَّذِينَ ظَلَمُواْ إِذْ يَرَوْنَ الْعَذَابَ أَنَّ الْقُوَّةَ لِلّهِ جَمِيعاً وَأَنَّ اللّهَ شَدِيدُ الْعَذَابِ )[40] .

واتە: ( لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگە ئاشکرایانەدا ) هەندێك کەس هەیە لەجیاتی ئەوەی خواپەرست بێت ، شتانی تر دادەتاشێت بۆ خۆی و ( شوێن ڕێنموویەکانی خوا ناکەوێت و ) خۆشەویستی و سۆزی دەدات بەو بت و بەرنامۆلکە و توولە ڕێگەیانە و خۆشی دەوێن ، وەك چۆن ئیمانداران خوایان خۆش دەوێت ، بەڵام ئەوانەی ئیمان و باوەڕیان هێناوە زۆر زیاتر خوایان خۆش دەوێت (هەر بەراورد ناکرێت ) جا ئەوانەی کە ستەمیان کردووە گەر دەیانزانی لە کاتێکدا کە بەچاوی خۆیان ڕووبەڕووی ئەو سزایە دەبنەوە ، کە بەڕاستی بۆیان دەردەکەوێت کە هێزو تواناو دەسەڵات هەر هەمووی بە دەست خوایە و دڵنیا دەبوون کە ئەو خوایە سزاکەی زۆر بە ئازارە (بۆ ستەمکاران ) ).

جۆری دووەم لەجۆرەکانی هاوبەشدانان بۆ الله: هاوبەشدانانی بچوکە ئەویش بریتیە لە ڕیا واتە پێش چاویی (ڕووپامایی ) ، الله تعالى فەرموویەتی: ( قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَى إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ فَمَن كَانَ يَرْجُو لِقَاء رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَالِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا )[41] ، واتە: ( جا ئەوەی دەیەوێت بەدیداری پەروەردگاری شادبێت ، بەخۆشنودیەوە با کار و کردەوەی چاک و دروست ئەنجام بدات و بەهیچ شێوەیەک لە پەرستندا هیچ کەسێك نەکاتە هاوەڵ و شەریك بۆی ).

جۆری سێیەم لەجۆرەکانی هاوبەشدانان بۆ الله: هاوبەشدانانی شاراوە و نادیارە ، بەڵگەش لەسەری فەرموودەی پێغەمبەرە (صلى الله علیەو سلم) کە دەفەرمووێت : {الشرك في هذه الأمة أخفى من دبيب النمل على الصفاة السوداء في ظلمة الليل}. واتە: ( هاوبەشدانان بۆ الله تعالى لەناو ئەم ئوممەتەدا شاراوەترە لەشوێنی ڕۆیشتنی مێرووڵەی ڕەش لەسەر بەردی ڕەش لەتاریکی شەودا ).

---

[40] سورة البقرة: 165
[41] سورة الكهف: 110

## پ45/ جیاوازی چییە لەنێوان قەزا و قەدەر (القضاء والقدر)؟

و45/ ( القدر ) لە بنچینەدا وەرگیراوە لە مەصدەری وشەی ( قدر )، دوایش بەکارهاتووە بـۆ ( تەقـدیر ) کە بـریتیە لەیەکلاییکـردنەوە و ڕوون کـردنەوە ، وە بەکاردێـت لـەپـاش زالبـوون و بالادەسـتی دەسـتەلاتی تعـالی الله لەئەنـدازەدانانی بـۆ دروسـتکراوەکانی پێش دروستبوونیان .

بەڵام ( القضـاء ) : بەکاردێـت بـۆ بڕیارەکـانی کـەونی ( حـوکمی کەونـی )، بەڕوودانـی قەدەرەکان و ئەوانەشی کە نوسراوە لەکتێبی یەکەمدا ( لوح المحفوظ ) وە بەکاردێت بۆ ئەو قەدەرەی کە بریتیە لەیەکلاییکردنەوە و جیاکردنەوە ، وە دیسان ( القدر ) بەکاردێت بۆ ئەو ( القضاء ) ی کەبریتیە لەحوکمی کەونی بەڕووداني قەدەرەکان .

وە (القضـاء) بـەکاردێت بـۆ حـوکمی دینـی شـەرعی وەك الله تعـالی فەرمـوویەتی: ( ثُـمَّ لاَ يَجِدُواْ فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجاً مِّمَّا قَضَيْتَ )[42] .

واتە: ( دوای ئەوەش نابێت لە دڵ و دەروونیاندا هیچ ناڕەزاییەك دروست ببێت بەرامبەر ئەوەی کە داوەریت لەسەر کردووە ).

وە ( القضـاء ) بـەکاردێت بـۆ تەواوبـوون و کۆتـایی هـاتن بەشـتێك وەك الله تعـالی فەرموویەتی: ( فَإِذَا قُضِيَتِ الصَّلَاةُ )[43] ، واتە: ( جا کاتێك نوێژ تەواو بوو ) .

وە( القضاء ) بەکاردێت بۆ ئەنجامدانی هەمان کار وەك الله تعالی فەرموویەتی: ( فَاقْضِ مَا أَنتَ قَاضٍ )[44] ، واتە: ( چیت لەدەست دێت ئەنجامی بدە و درێغی مەکە ).

وە بەکاردێـت بۆ ئاشکراکـردن و پێشخستن لەهەواڵـدان ، وەك الله تعالی فەرموویەتی: ( وَنَادَوْا يَا مَالِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا )[45] .

واتـە: ( دۆزەخیـەکان هـاوار دەکـەن ، ئـەی مالـك (کـە فریشـتەی سەرپەرشـتیارە): دەبـا پەروەردگارت بمانکوژێت ، دەبا بمرین و کۆتایی بەم سەغڵەتیەمان بێت ).

---

[42] سورة النساء: 65

[43] سورة الجمعة: 10

[44] سورة طه: 72

[45] سورة الزخرف: 77

وه بەکاردێت بۆ بوونی سزا و سزادان ، وەك الله تعالى فەرموويەتی: ( وَقُضِيَ الأَمْرُ )[46] .
واتە: (ئیتر ئاوەکە ڕۆچوو ).
وه بەکاردێت بۆ توانا هەبوون بۆ ئەنجامدانی شتێك و تەواوکردنی ، وەك الله تعالى فەرموويەتی: (وَلَا تَعْجَلْ بِالْقُرْآنِ مِن قَبْلِ أَن يُقْضَى إِلَيْكَ وَحْيُهُ )[47] ، واتە: ( ئەی محمد صلى الله عليه وسلم) نەکەیت لە خوێندنی قورئاندا پەلە بکەیت: لە پێش ئەوەی وەحی و نیگای ئەو قورئانە تەواو ببێت بۆ لای تۆ (چونکە ئێمە نایەڵین فەرامۆشی بکەیت ).
وه بەکاردێت بۆ یەکلاییکردنەوە و حوکمدان ، وەك الله تعالى فەرموويەتی: ( وَقُضِيَ بَيْنَهُم بِالْحَقِّ )[48] .
واتە: ( فریشتەکان دەبینیت دەوری تەختی - شاهی شاهانیان - داوە و سەرگەرمی تەسبیحات و سوپاس و ستایشی پەروەردگاریانن و حەق و دادوەری لە نێوان هەمواند جێبەجێ کرا ).

وه هەروەها بەکاردێت بۆ دروستکردن ، وەك الله تعالى فەرموويەتی: ( فَقَضَاهُنَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ )[49] ، واتە: ( ئاسمانی کردە حەوت چین ).
وه بەمانای بەدڵنیای بڕانەوەی شتێك ، دێت وەك الله تعالى فەرموويەتی: ( وَكَانَ أَمْراً مَّقْضِيّاً )[50] ، واتە: ( ئیتر ئەو کارەش بڕیاری لەسەر دراوە و بڕاوەتەوە ).
وه بەکاردێت بۆ فەرمانکردنی دینی ، هەروەك وەك الله تعالى فەرموويەتی: ( أَمَرَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ )[51] ، واتە: ( فەرمانی داوە جگە لە خۆی کەسی تر نەپەرستن ).

وه بەکاردێت بۆ گەشتنی بەپێداویستییەك ، لەوانەش: پێداویستییەکەم جێبەجێکرد ، وە بەکاردێت بۆ پابەندبوونی دوو کەس بەحوکمێك ، وە بەکاردێت بۆ بەجێگەیاندنی

---

[46] سورة هود: 44
[47] سورة طه: 114
[48] سورة الزمر: 75
[49] سورة فصلت: 12
[50] سورة مريم: 21
[51] سورة يوسف: 40

کارێك ، وەك الله تعالى فەرموویەتی: ( فَإِذَا قَضَيْتُم مَّنَاسِكَكُمْ )[52] ، واتە: ( جا هەر کاتێك ئەرك و مەناسیکەکانتان بەجێ هێنا ).

وە (القضاء) لەهەموویدا: مەصدەرە ، وە وە ( اقتضى ) بەڵگە ئەدات لەواجبێتی فەرمانێك ، وە الاقتضاء: زانستە بەچۆنیەتی ڕێکخستنی شێوەیەك وەك گوتەیان: ( لا أقضي منه العجب ) ، الأصمعي فەرموویەتی: دەمێنێت و کۆتایی پێ نایەت .

پ46/ ئایا قەدەر باش وخراپی هەمووی لەلایەن الله وەیە یاخود نا ؟

و46/: قەدەر باش و خراپی لەسەر گشتیە ، لە علیەوە الله تعالى لێی ڕازی بێت فەرموویەتی: لەجەنازەیەك بووین لە (بقيع الغرقد) جا پێغەمبەری الله (صلى الله عليه وسلم) هات و دانیشت ئێمەش لەچواردەوری دانیشتین ، وە گۆچانێکی لابوو ، تێڕاما و بەگۆچانەکەی لەزەوی ئەدا و دواتر فەرمووی: ( هیچ یەکێك لە ئێوە نییە لەنەفسی نێرینە و مێینە بەدڵنیایەوە الله شوێنەکەی نوسیوە و دیاری کردووە لەبەهەشتە یاخود لەدۆزەخە وە بەدڵنیایەوە نوسراوە لەسەری ئایا خراپەکارە و بەدبەخت و چارەڕەشە یاخود چاکەکارە و خۆشحال و بەختیار و خۆشگۆزەرانە )) ، فەرمووی: پیاوێك فەرمووی: ئایا بۆ لەسەر کتێبی خۆمان نەمێنینەوە و واز لەکردەوە نەهێنین ؟ پێغەمبەری الله (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: ( ئەوەی لەکۆمەڵەی خۆشگوزەرانان بێت ئەوا دەچێت بۆ ئەوەی کاری وەك ئەوان بکات ئەوەیشی لەکۆمەلەی ناڕەحەتییدا و ناخۆشیدا بێت ئەوا کاری وەك ئەوان دەکات ). پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ( فَأَمَّا مَن أَعْطَى وَاتَّقَى (5) وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَى (6) فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَى (7) وَأَمَّا مَن بَخِلَ وَاسْتَغْنَى ( وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَى (9) فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَى (الليل:5- 10 وفي الحديث: { واعملوا فكل ميسر ، أما أهل الشقاوة فييسرون لعمل أهل الشقاوة ، وأما أهل السعادة فييسرون لعمل أهل السعادة} ثم قرأ ( فَأَمَّا مَن أَعْطَى وَاتَّقَى (5) وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَى (6) فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَى (7) وَأَمَّا مَن بَخِلَ وَاسْتَغْنَى ( وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَى (9) فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَى )[53] ، واتە: (جا ئەوەی ( ماڵ و

[52] سورة البقرة: 200

[53] سورة الليل: 5 _ 6 _ 7 _ 8 _ 9 _ 10

ساman و زانستی و... هتد) دەبەخشێت و پارێزکار و لە خواترسە * بڕوای بتەوی بە پاداشتی چاك و بەنرخی خوایی هەیە * ئەوە ڕێگەی چاكە و چاكەكاری بۆ ئاسان دەكەین و سەرئەنجام دەیخەینە خێر و خۆشیەوە * بەڵام ئەوەی ڕەزیل و دەست نوقاو بێت و خۆی بێ نیاز بزانێت ( ڕەزامەندی خوایی مەبەست نەبێت * بڕوای نەبێت بە پاداشت و بەهرەی چاكی خوایی و بەدرۆی بزانێت * ئەوە ئێمە ڕێبازی تەنگانە و ناخۆشی بۆ ئاسان دەكەین و سەرئەنجام بە دۆزەخی دەگەیەنین ).

## پ47/ واتای ( لا إله إلا الله ) چییە ؟

و47/ واتاكەی بریتیە لەوەی كە هیچ پەرستراوێكی حەق نییە شایەنی پەرستن بێت تەنها الله نەبێت ، وە بەڵگەش وتەی الله تعالی یە كەوا فەرموویەتی: ( وَقَضَى رَبُّكَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ )[54] .

واتە: ( پەروەردگاری تۆ بڕیاریداوە كە جگە لەو كەسی تر نەپەرستن ).

جا وتەكەی ( أَلاَّ تَعْبُدُواْ ) واتاكەی ئەوەیە كە هیچ پەرستراوێكی حەق نییە ( لا إله )، وە وتەی ( إِلاَّ إِيَّاهُ ) واتە جگە لە الله ( إلا الله ) واتە تەنها الله نەبێت .

## پ48/ ئەو تەنها الله پەرستییە كامەیە كە الله پێش نوێژ و ڕۆژوو فەرزی كردووەتە سەر بەندەكانی ؟

و48/ بریتیە لە تەنها الله پەرستی لەعیبادەت و پەرستشەكان ، هاوار لەكەس مەكەن تەنها لە الله نەبێت كە تاك و تەنهایە و هیچ هاوەڵ و هاوبەشێكی نییە ، وە داوا لەپێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) مەكەن وە داوا لەهیچ كەسی تریش مەكەن ، هەروەكو الله تعالی فەرموویەتی: ( وَأَنَّ الْمَسَاجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدْعُوا مَعَ اللَّهِ أَحَداً )[55] .

واتە: ( دڵنیابن كە: مزگەوتەكان تایبەتی خوای گەورەن ، دەبێت هەر ئەوی تێدا بپەرسترێت و ناوی كەسی تر نەكرێتە شەریك و هاوتای ناوی ئەو زاتە ).

---

[54] سورة الإسراء: 23

[55] سورة الجن: 18

پ49/ کامەیان باشترینە: هەژارێکی ئارامگر یانیش دەوڵەمەندێکی سوپاسگوزار ؟ وە سنوری ئارامگرتن چییە و سنوری سوپاسکردن چییە ؟

و49/ بەڵام بابەتی دەوڵەمەندی و هەژاری ، کەسی ئارامگر و کەسی سوپاسگوزار هەردووکیان لەباوەڕدارە باشەکانن ، وە چاکترینیان بەتەقواترینیان و خۆپارێزرینیانە هەروەکو الله تعالی فەرموویەتی: ( إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ )[56] ، واتە: ( بەڕێزترینتان لای خوا ئەو کەسانەتان کە زۆرتر لەخوا ترسە و فەرمانبەرداری خوایە ).

بەڵام سنوری ئارامگرتن و سنوری سوپاسکردن: ئەوەی زۆر بەربلاوە لەنێوان زانایاندا کە ئارامگرتن ئەوەیە نارەحەت نەبیت ، وە سوپاسکردن ئەوەیە گوێڕایەڵی الله بیت بەو نیعمەتانەی پێی داوی .

پ50/ بەچی ئامۆژگاریم دەکەی ؟

و50/ ئامۆژگاریت بە تێگەیشتن لەتەوحید دەکەم ، وە کتێبەکانی تەوحید بخوێنیتەوە چونکە ئەو کتێبانە ڕاستی و حەقیقەتی تەوحیدت بۆ ڕوون دەکەنەوە کە الله پێغەمبەری بۆ ناردووە (صلی الله علیه وسلم) ، وە ڕاستی و حەقیقەتی شیرك کە الله و پێغەمبەرەکەی ( صلی الله علیه وسلم ) قەدەغە و حەرامیان کردووە ، وە هەواڵیداوە کە لێخۆشبوون نییە بۆ ئەو کەسەی شیرك ئەنجامدەدات ، وە بەهەشت لەسەر ئەنجامدەرەکەی ( ئەنجامدەری شرك ) قەدەغەکراوە ، وە هەرکەسێك شیرك ئەنجامبدات کردەوەکانی پوچەڵ دەبنەوە .

وە بەهەموو هەوڵێك هەوڵی زانینی ڕاستی ئەو تەوحیدە بدە کە الله پێغەمبەرەکەی بۆ ناردووە ( صلی الله علیه وسلم ) ، وە مرۆڤ بەو تەوحیدە دەبێتە موسڵمانێکی جودا بوو لەشیرك و ئەهلەکەی ( واتە لەشیرك و ئەوانەی شیرك ئەنجام دەدەن ) .

چەند وشەیەکم بۆ بنوسە الله بەو وشانە بمکاتە سوودبەخش پێی .

یەکەم شت کەئامۆژگاریتی پێ دەکەم: ئاوڕدانەوەی لەوەی محمد (صلی الله علیه وسلم) هێناویەتی و پێی هاتووە لەلایەن الله تبارك وتعالی وە ، چونکە لەلای الله وە هاتووە

[56] سورة الحجرات: 13

بەهەموو ئەو شتانەی مرۆڤ پێویستی پێیەتی ، هیچ شتێکی بەجێنەهێشتوە لە الله و بەهەشتەکەی نزیکیان بکاتەوە ئیلا فەرمانی پێکردوون .
وە نەهیچ شتێك کە لە الله دووریانبخاتەوە و لەسزا نزیکیان بکاتەوە ئیللا ڕێگری لێکردوون و ئاگاداری لێ کردوونەتەوە .

وە الله ئیقامە حوججەی هەموو دروستکراوەکانی کردووە تا هەستانی قیامەت ، وە هیچ کەسێك بیانو و حوججەی لای الله نییە پاش ناردنی محمد (صلی الله علیه وسلم).
وە الله تعالی لەبارەی پێغەمبەر محمد (صلی الله علیه وسلم) و برا پێغەمبەرەکانییەوە فەرموویەتی: ( إِنَّا أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ كَمَا أَوْحَيْنَا إِلَى نُوحٍ وَالنَّبِيِّينَ مِن بَعْدِهِ وَأَوْحَيْنَا إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالأَسْبَاطِ وَعِيسَى وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَارُونَ وَسُلَيْمَانَ وَآتَيْنَا دَاوُودَ زَبُوراً (163) وَرُسُلاً قَدْ قَصَصْنَاهُمْ عَلَيْكَ مِن قَبْلُ وَرُسُلاً لَّمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَ وَكَلَّمَ اللّهُ مُوسَى تَكْلِيماً (164) رُّسُلاً مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلاَّ يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ وَكَانَ اللّهُ عَزِيزاً حَكِيماً (165))[57] .

واتە: ( بەڕاستی ئێمە (وەحی) و نیگامان بۆ تۆ ناردووە هەر وەکو چۆن (وەحی) و نیگامان بۆ نوح و پێغەمبەرانی دوای ئەو ناردووە ، هەروەها (وەحی) و نیگامان ناردووە بۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و (هەندێك) لە کوڕانی یەعقوب و عیسا و ئەیوب و یونس و هاروون و سولەیمان ، زەبوریشمان بە داود بەخشیووە ( کتێبێك بووە زۆربەی تەسبیحات و ستایشی پەروەردگار بووە * بێگومان بەسەرهاتی هەندێك لە پێغەمبەرانمان بۆ گێڕاویتەوە ، بەسەرهاتی هەندێکی تریشمان بۆ نەگێڕاویتەوە ، بەڕاستی خوای گەورە خۆی لەگەڵ موسادا گفتوگۆی یەکسەری و ڕاستەوخۆی ئەنجامداوە * پێغەمبەرانمان (ڕەوانە کردووە) کە مژدەدەرن (بە ئیمانداران) و ترسێنەرن بۆ (یاخیەکان) ، تا خەڵکی هیچ بەڵگەیەکیان بەدەستەوە نەمێنێت (لەسەر بێ دینی و یاخی بوونیان) دوای ئەوەی خوا پێغەمبەرانی بۆ ڕەوانە کردوون ، بێگومان هەمیشەو بەردەوام خوا باڵادەست و دانایە ).

---

[57] سورة النساء: 163 _ 164 _ 165

وه گەورەترین شت کەلەلایەن الله وه هێناویەتی و یەکەم شت کە الله فەرمانی پێکردووه تەوحیـدی الله یـە لەپەرەسـتنی الله و هاوبەشـدانەنانه بـۆی ، وه ئـیخلاص لەدینەکەیـدا (واتـه دیـن تـەنها بۆ الله بێت) وەکو چۆن الله تعـالی فەرموویەتی: (يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ (1) قُمْ فَأَنذِرْ (2) وَرَبَّكَ فَكَبِّر (3))[58] .

واتە: ( ئەی ئەو کەسەی خۆت پێچاوەتەوه ، ئەی محمد صلی الله علیه وسلم * هەستەو خەڵکی بێداربکەرەوه (ڕاستیەکان ڕوون بکەرەوه) * پەروەردگارت بە گەورە ناوببە (الله اکبر ، با دروشمت بێت ، مەزنی ئەو زاتە ڕوون بکەرەوه ).

واتای وتەی ( وَرَبَّكَ فَكَبِّر ) واتە: الله بەمەزنی ڕابگرە لەڕێگەی تەوحید و نیەت پاکی لە عیبادەت بێ هاوەڵ و هاوبەشدانان بۆ الله تعالی ، وه ئەمەش پێش فەرمانکردن بەنوێژ و ڕۆژو و زەکات و حەج و جگلە لەمانە لەدروشمەکانی تری ئیسلام ، وه واتای ( قُمْ فَأَنذِرْ ) واتە خەڵك ئاگاداربکەوه لەئەنجامدانی شیرك لەپەرستنی الله کە تەتاك و تەنهایە و هیچ هـاوەل و هاوبەشـێکی نییـە ، وه ئەمەش پـێش ئاگـادارکردنەوەیە لە زینـا و دزی و ڕیبـا (سوو) و ستەمکردن لەخەڵك و بێجگە لەمانە لەتاوانەگەورەکان .

وه ئەم بنچیـــنەیە گـــەورەترین بنچینـــە و فەرزترینیشـــیانە ، وه بـــۆ ئەم هۆکـــارە الله دروستکراوەکانی دروست کردووه ، وەکو چۆن الله تعالی فەرموویەتی: ( وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ )[59] .

واتە: ( بێگومان من پەری و ئادەمیزاد م دروست نەکردووه تەنها بۆ ئەوە نەبێت کە من بپەرستن و فەرمانبەردارم بن ).

وه بۆ ئەم هۆکارە الله پێغەمبەرانی ناردووه و کتێبەکانی دابەزاندووه ، هەروەك الله تعالی فەرموویەتی: ( وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولاً أَنِ اعْبُدُواْ اللّهَ وَاجْتَنِبُواْ الطَّاغُوتَ )[60] .

[58] سورة المثر: 1 _ 2 _ 3
[59] سورة الذاريات: 56
[60] سورة النحل: 36

واتـه: ( سـوێند بـه خـوا بێگومـان ئێمـه لـەناو هـەر گـەل و نەتەوەیەکدا پێغەمبـەرێکمان ڕەوانـەکردووە و پێمـان ڕاگەیانـدووە کە پێیان بڵێت: تـەنها خـوا بپـەرستن ، خۆتـان دوورە پەرێز بگرن لە هەموو پەرستراوێکی تر ).

وە لەبەر هەمان هۆکار خەلك جیاکراونەتەوە لەنێوان موسڵمان و کافر ، وە هەرکەسێك لەڕۆژی دوایـی هـاتەوە بـۆ لای الله و موەحیـد بـوو وە هـیچ هـاوەل و هابەشـێکی بـۆ بڕیـار نەدابـوو دەچێـتە بەهەشـتەوە ، وە ئەوەش هاوبەشـی بـۆ الله ئەنجامـدابوو دەچێـتە نـاو ئاگری دۆزەخەوە ئەگەر لەهەموو بەندەکانیش عیبادەتی زیاتربێت .
وە ئەمە واتای وتەکەتە: ( لا إله إلا الله ) ، چونکە پەرستراو و خودا (الإلـه) ئەوەیە بانگ دەکرێت و پاڕانەوەی لا ئەکرێت بۆ هێنانی چاکە و لابردنی خراپە ، وە لێی دەترسێت و پشتی پێ دەبەسترێت .

وآخِرُ دعوانـا أنِ الحمدُ لله ربِّ العـالمين ، وصلَّى الله على نبيِّنا محمَّدٍ وعلى آلـه وصحبِه وإخوانِه إلى يوم الدِّين ، وسلَّم تسليمًا .